# کورد دوژمنی خۆت بناسە

## یاداشتەکانی لێزانێکی موخابەرات

## بەرگی (4)

رەفیق پشدەری

2002 ز

پێشکەشە...

بەهەموو کوردێکی پشت ئەستوورو باوەڕدار بەرەوایی مافی گەلی کوردستان...

بەگیانی شەهیدە پاكو بێگەردەکانمان" ئەوانەی بەخوێنی گەشو ئاڵیان ئەم بەشە ئازادکراوەی کوردستانیان رزگارکردو ئازادیی‌و هێمنی‌و ئاسایشیان فەراهەم هێنا.

ئەو شەهیدانەی بەرگریان کرد لەگۆڕەپانی جەنگداو، لەڕا پەڕینی پیرۆزدا وەك قەڵغانێك وەهابوونو، لەکۆرەوی گەلی کوردستاندا بەرگریان کرد لەکاتێکدا خەڵکی لەزوڵمو ستەمی سەدام هەڵدەهاتن..

بەوکەسانەی خوەلیاو ئالوودەی راستین... خاوەن بیروباوەڕوو دەروونە پاکەکان...

باهەموو دەست لەنێو دەست کەین بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەی حزبە سیاسیەکانی کوردستان دروستیان کردووەو، بووەتە هۆی پێکهاتنی بەربەستێك لەنێوان گەلو ئیدارەی حکومەتی کوردستاندا.

هەروەها بۆئەوەی یەك دەنگو رابین چاوپۆشین لەگلەیی‌و گازندەو رق‌و کینە" کەلەئەنجامی دەوڵەمەندبوونی سەرکردەو بەرپرسەکان لەسەرگیانی گەل پێکهاتووەو دەرەنجامەکەشی بەخۆش گوزەرانی هەندێكو بێبەش بوونی هەندێکی تر کۆتایی هاتووە...

بۆیە ئەرکی سەرشانی گەلی کوردستانە رازیبێت بەو واقعە" چونکە چارەنووسی ئەزموونەکەمان راگیراوە لەسەر پشتگیریی گەل بۆ ئەو حکومەتەو، لە پێناوەی ئەوەشدا گەل بەهیواو ئاواتەکانی خۆی بگات.

دەبا دەست بەرداری خەونە وەنەوشەییەکانو گلەیی‌وگازندە ببینو مامەڵەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ واقعدا بکەین بەو چەشنەی بەبارهاتووە، با هەمووشمان بەیەك دەنگ هاوار بکەینو بڵێن : بژی کورد... بژی کوردستان ...

## پێشەکی

# خوێنەری بەرێز

خزمەتکاری کورد و کوردستان دوو شتتان عەرزدەکات، سلاٌویك و پرسیارێك ...یەکەمیان سلاٌوێکی شۆڕشگێڕانەی بەدل و راستگۆیانە، دووەمیشیان ئەوەیە ئامانجێکی پیرۆز لەبەرچاوبگرن و ئەو پرسیارە لە لەمێشکی خۆتان دەربکەن کەئێوە چی بوون و بیروباوەڕتان چیبوو، بەڵکو باهەموو مەبەستێکمان هەوڵدان بێت بۆ خۆکۆکردنەوەو پاراستنی یەکرِیزیمان لەژێر یەك ئالاٌدا، بێئەوەی بایەخ بەرەنگی ئەو ئالاٌیە بدەین بەلاٌم بەمەرجێك ئالاٌیەکە گەلی کورد بنوێنێت بەهەموو چین ولایەن و توێژێکیەوە، دوور لە بەرژەوەندیی تەسکی کەسیو دوور لەسایەو سێبەری هیچ دەوڵەتێك لەدەوڵەتانی دراوسێ ...

کەواتە بابەدڵ و بەکوڵ " کار بۆ دواڕۆژێکی پرشنگدارو ئارام و ئاسوودەتر بکەین بەلاٌم ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزمان لەبەرچاوبێت کەخوا دەفەرموێت ﴿ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم ﴾ .

بەڕێزان :

لەدوا بەشی کتێبەکەم (بەرگی سێیەمی کتێبی : کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا ئاماژەم بەوەدابوو کە بەهۆی باری ناجۆری کوردستان بەتەمانیم کتێبێك دەربارەی موخابەرات دەربکەم، چونکە چاوەڕێی بارودۆخێکی جیاوازو ئارامترم دەکرد، بەلاٌم چەند رووداوێکی سیاسی بەشێوەیەکی کتوپڕ بەسەرداهاتن وایان لێکردم بترسم ئەم هەلەی ئێستام لەدەست دەرچێت، لەولاشەوە خوێنەرانم بەگەرمەوە داوایان لێم دەکرد کەدەست بکەم بەنووسین و بلاٌوکردنەوەی ئەم کتێبە ئەویش بۆ شارەزابوون (ئەگەر کەمیش بێت) لەلایەنە پەنهانەکانی دەزگای موخابەرات و راستی ئەم دەزگایە کە لەئەنجامی کارکردن و زانیاری کۆکردنەوەی خۆمەوە ؛ کەسالاٌنێکی دوورودرێژ بەدەستم هێناوە لەم بوارەدا، لەوانەیە بەهۆی ئەم کتێبەمەوە لایەنە پەیوەندارەکان بەمەرامی خۆیان بگەن .لێرەدا پێویستە هاندەری سەرەکی لەبیرخۆم نەبەمەوە بۆ بلاٌوکردنەوەی ئەم کتێبە، ئەویش ئەو بارودۆخە شارستانیەی کەدەتوانم بڵێم بارودۆخە دەگمەنەکەی ئەم بەشە رزگارکراوەی خاکی کوردستانە کەئازادیی لەچاپدانی کتێب و بلاٌوکردنەوە سیمایەکی دیاریەتی، کەلەم بارەیەوە نابێت کاریگەریی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەك حزبێکی فەرمانڕەوا پشتگوێ بخرێت کەکاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر رەوتی ئازادیی لەچاپدان و بلاٌوکردنەوە لەناوچەی دەسەلاٌتیدا، چونکە هەروەکو چەند کەسێك لەوانەی لەولاٌتانی رۆژئاوا نیشتەجێبوونە دەڵێن کتێبخانەکانی شاری سلێمانی کتێبی وایان تێدا دەفرۆشرێتو نیشاندەدرێت زەحمەتە لەئەمریکاو بەریتانیا رێگە بەبلاٌوکردنەوەو فرۆشتنیان بدرێت .

سەرباریشی بەقایلییەوە دەڵێم کەبنیاتی کۆمەڵگەی شۆڕشگێڕو رۆشنبیری ئەم ناوچەیەی لێوان لێوە بەگیانی نیشتمانیو ئاراستەی داهێنەری رۆشنبیری، بۆتە سەنگەری پاراستنی کەسانێکی وەکو من... کەئەمە هانم دەدات بەئاشکراو بی ترس بنووسم و ئەوەی لەدڵمدایە بەنووسین بلاٌوی بکەمەوە ...خوای گەورە ئاگاداریی هەموومان بکات .

# دەزگای موخابەرات

هەرکەباسی ئەم دەزگایە دێتە ئاراوە پرسیارێك بەمێشکدا دێت کەئایا دەزگای موخابەرات چییە؟ لەچی پێکدێت وکاری چییە؟... لەگەڵ چەندین پرسیاری تر کەئەوەندی شارەزاییم لەماوەی کارکردنم لەدامودەزگا ئەمنییەکانی عێراق و ئەزموونی تەمەنم کەلەدنیای سیاسەتدا بردوومەتەسەر، هەروەها تێکەڵبوونم لەگەڵ سیاسەتمەداران بۆیان رەخساندووم، وەڵام دەدەمەوە .

لەهەرسێ بەشی کێتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەدوورودرێژی باسی ئەوەمکردووە کەچۆن پێم نایە جیهانی موخابەراتیەوە، وابزانم ئەوەش بایی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەیە، بەڵگەیەکیش هەیە کەهەرچەندە شایەدییەکە لەلایەن دوژمنەوە بەڵام هێشتا شانازی پێوەدەکەم، ئەو بەڵگەیەش لەبەرگی یەکەمی کتێبی ناوبراودا باسمکردووە، هیوادارم کەلێرە باسیدەکەوە گلەییم لێنەکرێت. لەدانیشتنێکمدا لەگەڵ بەرێوەبەری پێشووی موخابەراتی عێراقی، بەرێز سەعدون شاکردا، دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەیەکمان کاتێك مۆڵەتم لێخواست بڕۆم، ئەو پێشم کەوت دەرگای ئەسانسۆرەکەی بۆ کردمەوە . سەرەتا وامزانی لەگەڵ مندا دێتە دەرەوە کەچی گوتی: مامۆستا رەفیق فەرمو. گوتم: رێی تێناچێت بەرێزتان دەرگام بۆ بکەنەوە چونکە لەپلەدا جیاوازیمان زۆرە. گوتی: لەراستیدا دەبوایە سییەکی دەزگای موخابەراتم بدایەتە دەستی تۆ بەڵام... لێرەدا قسەکەیم پێبڕی و گوتم : ئەگەر بەرەگەز عەرەب بوومایە هەموو دەزگاکە دەخرایە بەردەستم. ئەو پێکەنیو گوتی: بەخوا ڕاست دەکەیت، تۆ شایەنی ئەوەیت .

راستییەکی ئاشکرا هەیە ئەویش ئەوەیە کەهەموو دروستکراوێکی مرۆڤ، چاکەو خراپەی خۆی هەیە چ لەرووی تەکنیکی بێت چ لەڕووی ئایدۆلۆجی. ئەوەی دەنکە شخارتەیەکی داگیرساو بەدەستیەوە بگرێت دەردەکەوێت کەبۆ مەبەستێکی چاکیەتی یان مەبەستێکی خراپ، لەوانەیە بۆ داگیرساندنی زۆپایەکی بێت یان ئامادەکردنی خۆراك، یان لەوانەیە بۆ گڕتێبەردان و وێرانکردن بێت .

بۆیە دەڵێین خراپ بەکارهێنانی دەزگای موخابەرات لەلایەن فەرمانڕەوا ستەمکارو شۆڤێنیستەکانەوە بۆ سەرکوتکردنی گەلە داماوو کلۆڵەکانیان، ناوی ئەم دەزگا بایەخدارەی زڕاندووەو لەبەرچاوی خەڵك رەشی کردووەو کردوویەتی بەدەزگایەکی تۆقێنەر، لەکاتێکدا ئەم دەزگایە فاکتەرێکی بنەڕەتییە بۆ سەقامگیرکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەت، هەروەها زەنگێکە لەرێکەیەوە دامودەزگای حکومەت لەو مەترسییانە ئاگاداردەکاتەوە کە لەناوخۆی وڵات یان لەدەرەوەیدا رووی تێدەکەن. جگە لەوەی ئەم دەزگایە وەك چاودێر وایە بەسەر کارمەندو کارگوزارانی دەوڵەتەوە کەهانیاندەدات هەوڵبدەن و تێبکۆشن، هەروەها خۆیان لەهەرشتێك بپارێزن کەدەشێ لەکەداریان بکات ... لەکۆتاییشدا دەزگای موخابەرات پێوەرێکە ئاست و توانای وزەی کارمەندانی دەزگای کارگێڕیمان نیشاندەدات و رێگەمان بۆ رۆشن دەکات کەئەم کارمەندە خەڵات بکەین و ئەوەی تر لەکاربخەین .

لەبەرئەمە شارەزایی پەیداکردن دەربارەی دەزگای موخابەرات کارێکی گرنگە، لەهەمانکاتدا کارکردن لەچوارچێوەی ئەم دەزگایەدا شتێکی ئاسان نییە، چونکە ئەمە وەك هاوکێشەیەکی ژمارە نییە کەئەزبەر

**بكرێت و ببڕێتەوە وەك ئەوەی کەدەگوترێت (١+١=٢) ئیتر ئەمە کۆتایییە، بەڵکو کارکردن لەم دەزگایەدا لەڕێگەی شارەزابوون دەبێت لەپرنسیپیەکانی، ئەویش بەهۆی ئامادەکردن و پێگەیاندنی کادران لەرێی خولی داڕێژراو، چونکە ئەمە دەزگایەکی ئەمنی وەهایە لەکۆنەوە بۆ سیخوڕیکردن و پەیدۆزی(استطلاع)بەکارهاتووەو، پێبەپێی فراوانبوونی تەماعکردنە دەسەڵات و بەرپابوونی ململانێ لەسەر پلەوپایەو دەستگرتن بەسەر وڵاتاندا، ئەمیش پەرەی سەندووە .**

بنیاتی دەزگای موخابەرات

**دەزگای موخابەرات پێکدێت لە: بەرێوەەر، سەرۆك بەشەکان و کارمەندەکانیان، هەریەکە لەم بەشانە ئەرکێکی لەئەستۆیە بۆ راپەڕاندنی.**

**خەسڵەتەکانی بەرێوەبەر چین ؟**

**١- دەبێ سەر بەبنەماڵیەکی ناوداری وڵات بێت .**

**٢- جێی بڕوای حکومەت بێت بەتایبەتی سەرۆکی وڵات کەدەبێ متمانەی نێوانیان سەد دەر سەدبێت .**

**٣- دڵسۆزو دەستپاك و زیرەكو وتووریابێت، لەگفتوگۆ و کاروباردا دانەمێنێت، حازر بەدەست بێت .**

**٤- سەرنەرم و بێباك و دڵفراوان بێت چونکە بەرێوەبردنی وڵات، بەکردەوە لەئەستۆی ئەودایە .**

**سەرۆکی بەشەکان لەدوای هەڵسەنگاندنیان دادەمەزرێنرێن، ئەویش لەلایەن خودی بەڕێوەبەرو بەئاگاداریی سەرۆکی وڵات. هەریەکە لەو سەرۆك بەشانە کاروباری بەشێکی دەزگاکەیان پێدەسپێردرێت کە بەتەواوەتی لەبەڕێوەبردنی بەرپرسیار دەبن و فەرمانەکان بەبێ‌مشتومڕ جێبەجێ دەکەن، نابێت لەجێبەجێکردنی فرمانەکاندا کەمتەرخەمی بنوێنن هەروەها بەهۆی نەخۆشییەکی کتوپڕ نەبێت دەزگا بەجێ‌نەهێڵن، یان بەهۆی گواستنەوە بۆبەشێکی تر یان رەوانەکردنیان بۆ دەرەوەی وڵات، یان مردن .**

**ژمارەی بەشەکانی دەزگای موخابەرات پەیوەندی بەقەوارەی دەزگاو توانای داراییەوە هەیە کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆی تەرخان دەکرێت . واتە دەشێ لە ١٣ بەش یاخود ١١٣ بەش پێکبێت .بۆنموونە بڕی خەرجیی یەك مانگی دەزگای پنتاگۆنی ئەمریکی، بەشی خەرجیەکانی چەند مانگێکی بەڕێوەبردنی فەرەنسا دەکات. واتە باری ئابوری، قەوارەی دەزگای موخابەرات و ژمارەی بەشەکانی دیاریدەکات .**

**دوای دامەزراندنی سەرۆکی بەشەکان، ئەندامانی دەزگا هەڵدەبژێردرێن و دادەمەزرێنرێن. ئەمانە دەبێ سەر بەهەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەبن وەك: خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا، خاوەنی بڕوانامەی ماجستێر، مامۆستای قۆناغی ئامادەیی‌و ناوەندی، مامۆستای قۆناغی سەرەتایی، خوێندکار، شێخ، مەلا، ئەفسەری سوپا یاخود هی پۆلیس، سەرباز، کرێکار، شۆفێری تەکسی، جووتیار، نانەوا، خاوەنی چێشتخانە، خاوەنی چایخانە، خاوەنی مەلها، گۆرانی‌بێژ، سەرتاش، سەڕاف، بنووس، تەنانەت پیاوی وا کە لەگەڵ ئافرەتی سوزانیدا کاردەکات. بەکورتی دەشێ لەهەر توێژێکی کۆمەڵگە بێت و پێویستە هەریەکە لەمانە کەکاری خۆی گرتە دەست بەبێ کەموکورتی فەرمانەکان جێبەجێ بکات .**

ئـــەوەی لەســـەر بەڕێوەبـــەری دەزگـــاو ســـەرۆکی بەشـــەکان پێویـــستە کـــەبیزانن، ڕووداوە دێرێنـــە سیاسـییەکانی جیهانـە لـەڕووی فێـلْ و تەڵـەك، پـیلان، کودەتـا، پرۆسـەکانی تیرۆرکردنـی سـەرکردەی وڵاتان، شۆڕشە سەرکەوتوو و شکست خواردووەکان، هەروەها دەقە بەدەقە بەسەکردنەوەی دەنگوباسـی جیهـان و شـارەزایی تـەواو دەربـارەی سیاسـەت و ئابووریناسـی، چـونکە هـەموو سیاسـییەك شـارەزایە لەبواری ئابووریدا. گرنگترین هۆکاریش کەببێتـە مایـەی سەرخستنی دەزگـای موخابـەرات بەشێوەیەکی ڕێکوپێـك و لەسـایەی دەسـەڵاتێکی دادپـەروەردا هەسـتی نیـشتمانپەروەرییە. چـونکە کارمەنـدی ئـەم دەزگایە لەگەڵ ئەوەی ڕۆژانە زانیاری دەربـارەی زانستە سیاسییەکان بەگشتیو موخابـەرات بەتایبـەتی وەردەگرێت، لەهەمان کاتدا دەبێت ڕۆژانە بیروهۆشـی بەمـەزنترین خۆشەویستی زاخاوبدرێت کەئەویش خۆشەویـستیی خاکـە. ئـەم پرۆسـەیەش بەپلـەی یەکـەم پـشت بەسـەرۆکی دەوڵـەت دەبەسـتێت، لـەدوای ئـەویش بەڕێوەبـەری دەزگـای موخابـەرات و پاشـان سـەرۆکی بەشـەکان و لەکۆتاییـدا ئەندامـە کارمەنـدو کارگوزارەکان. واتە : دەبێت هەموو کارمەندەکان بەشێوەیەکی ڕاستگۆو بێپێچوپەنا هەست بـەوە بکـەن کەهەموو ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەشی دەکەن" هـەتا دەگاتـە ئاسـتی خـۆ بـەقوربانیکردن، هـەمووی لـەپێناو نیشتماندایە نـەك بەرامبـەر کـرێ یـاخود مووچـە یـاخود ڕازیکردنـی سـەرۆکێك. چـونکە ئـەوەی خـاوەنی هەسـتی نیشتمانپەروەری نـەبێت و، خۆشەویـستیی خـاك لەبیروهۆشـیدا ڕەگـی دانـەکوتابێت " شایەنی ئەوەنییە ناوی مرۆڤی لێبنرێت و، لەدواجاردا خێرناداتەوە .

جگە لەهـەموو ئەمانـە، لەسـەر حکومـەت پێویستە کەبودجەیـەکی وا تـەرخان بکـات کەپێویستیەکانی کارمەنــدانی ئـــەم دەزگایـــە دابـــین بکـــات بەشـــێوەیەك کەچـــاویان لەدەســـتی هـــیچ کـــەس ولایـــەنێك نـەبێت...شـتێکی بەڵگەنەویستیـشە کەنەداریودەسـتکورتی، دەردێکـی کوشـندەیە. هـەروەها پێویـستە لـەناو دەزگـای موخابەراتـدا، دەزگایـەکی بچووکی چاودێریی نهێنـی دابنرێـت، کـارگوزارانی ئـەم دەزگـا بچووکە لەخەڵکانێکی پێشگەیشتووی هۆشمەند پێکدێت کە لەڕووی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئەنـدامانی دەزگاکە، جیاوازی لەنێوان ئەم وئەودا نەکەن، بەڵکو بەشێوەیەکی بێلایەنانە زانیاری لەسـەر یەکەیەکـەی دەزگـا پێـشکەش بکـەن لـەپێناو پاکـژکردنی ڕیـزی ئەندامـەکان و دەستنیـشانکردنی کەسـانی بێـورە، بێتوانـا و نـەوێر. دیـارە چاوپۆشـی نـەکردن لەگـەڵ ناپاکانـدا قسەی تێـداناکرێت ...هـەروەها نابێـت مەســـەلەی دروســـتکردن و پێگەیانـــدنی گیـــانی دەســـت پێـــشخەریکردن و پێشخـــستن و نوێکردنـــەوەی دەروونـــی کارمەنـــدو کـــارگوزارانی دەزگـــای موخابـــەرات پـــشتگوێ بخرێـــت بـــەڵکو بەشـــێوەیەك وەکـــو فاکتەرێکی بنچینەیی ڕەچاوبکرێت کەببێتە کاری شەوو ڕۆژیان.

هـــەتا ئێـــستا سیاســـەتمەدار و مێژوونووســـان نـــەیانتوانیوە ســـەردەم و مێـــژووی ســـەرهەڵدان یـــان دامەزرانـدنی دەزگـای موخابـەرات دیـاری بکـەن . هـەروەکو پێشتریش ئامـاژەم پێـدا، موخابـەرات لەگـەڵ دەسەڵات و ململانێ سیاسییەکاندا پەیدابووە، دیـارە پێویستیش سەرچاوەو زادەی داهێنانـە مێـژووی ئەسکەندەری مەکدۆنیو باس وخواسی شەڕەکانی دەریدەخەن کەئەو سەکردە یۆنانییـە، ئـەم دەزگایـەی بـــۆ پـــەیبردن بەهـــەواڵی دوژمنـــانیو دیـــاریکردنی قـــەوارەی ســـەربازییان بـــەکاردەهێنا، هـــەروەها بـــۆ

ئاشــکراکردنی پیلانــەکانیان و خۆئامــادەکردن بــۆ پــەلاماردانیان کەئەمــە فاکتــەرێکی ســەرکەوتنە ســەربازییەکانی‌بوو، چــونکە نــەریتی وابــوو هــەتا هــەواڵی تــەواوو دروســتی دەربــارەی دوژمنــانی دەستنەکەوتایە نەدەچووە شەڕ لەگەڵیاندا .

پـــەرەپێدانی ئەم دەزگایە پێ‌بەپێی پێویستبوون‌و هۆشکردنی مرۆڤ بەردەوامبووە. ئنجا تەکنەلۆجیا هاتە ناو جیهانی موخابەرات بۆ سیخوڕیکردن و بەدەستهێنانی زانیاری سیاسی یان سەربازی " هەروەها بۆ تیرۆرو ئامانجی تر وەك بەهێزکردنی دەستەڵات‌و حوکمڕانی‌و بێهێزکردنی دەسەڵاتێکی تر" تەکنیکی پێشکەوتوو خرایەکار.

بۆنموونــە " پــێش جــەنگی دووەمــی جیهــانی، ئــەدۆڵف هتلــەر ــ ســەرۆکی پــارتی نیــشتمانیی سۆشیالیست و یەکە پیاوی دەوڵەتی ئەڵەمانیا لەو کاتەدا" ئەو پیاوە ئەفسانەییەی بۆ ماوەیەك هۆش وگۆشی بەملیۆنان لەخەڵکی سەراسیمەکرد، هەوڵیدەدا دەستەڵاتی بەسەر جیهاندا بسەپێنێت، بریاریدا پۆڵەندەی دراوسێ وڵاتی داگیربکات. بۆیە دەستیکرد بەگەڕان بۆ دۆزینەوەی هۆکارێکی بەجێ کە لەرێگەیەوە رای گشتیی جیهانی بەگشتی‌و هی گەلی ئەڵەمانی بەتایبەتی رازیبکات بۆ شەرعیەتدان بەوەی گوایە لەپێناو بەرگریکردن لەوڵات هەروەها بۆ بەرژەوەندیی خاك و نیشتمانی ئەلەمانیا، پۆڵەندە داگیردەکات .جا بەپێی ئەو ئایدیۆلۆجیایەی هەیبوو کەپێی دەناسرا، جارێکیان رۆژنامەنووسێك لێی پرسیبوو : (ئێستا بەرێزتان بیر لەچی دەکەنەوە؟) ئەو وەڵامی‌دابۆوە : ( **Just Jerman، nothing else**) !

کاتێکیش راوێــژی بــە ئەفســەرێکی دەزگــای موخابــەراتی ئــەڵمانی کــرد بــۆ دیتنــەوەی پاســاوێك بــۆ پەلاماردانی پۆڵەندە، ئەفسەرەکە نەخشەیەکی بێوێنەی بۆ کێشا کەیەکسەر جێبەجێ‌کردو ئامانجیشی پێکا. نەخشەکە بەم شێوەیەبوو :

ژمارەی(١٠٠)کەسیان لەزیندانییە کۆمۆنیستە ئەڵمانییەکان لەزیندانەکانی ئەڵمانیا هێناو بەوە قایلیانکردن کەئەگەر لەسەر سنووری نێوان پۆڵەندەو ئەڵمانیادا" ڕۆڵی سەربازی پۆڵەندی بگێڕن ئەوە ئازاد دەکرێن. ئنجا دوو کیلۆمەتر دوور لەسنووری پۆڵەندە ئیزگەیەکیان دامەزراند، لەرێگەی ئەو بەرنامانەیەوە کە بەزمانی ئەڵمانی پەخشی دەکردن گەلی ئەڵمانیای هاندەدا تا لەدژی حوکمی نازیست ڕاپەڕن، هەروەها جنێوی بەخودی ئەدۆڵف هتلەر دەدا، ئنجا دەستیکرد بەبڵاوکردنەوەی بەیاننامە بەناوی حکومەتی پۆڵەندە لەدژی هتلەرو حکومەتەکەی . لێرەدا ئەڵمانیا لەرێگەی باڵیۆزی پۆڵەندە لەئەڵمانیا، ئاگادارینامەیەکی ئاراستەی حکومەتی پۆڵەندەکرد کەبێگومان ئەو، نکوولی لەمەسەلەکەکرد کە لەراستیشدا لێی بێئاگابوو .بەڵام هتلەر ئەم دژە راگەیاندنەی پۆڵەندەی کردە بەهانەو لەئەنجامدا هێزە سەربازییەکانی ئەڵمانیا هێرشیان بردە سەر ئیزگەکەو ئەو سەد سەربازە کۆمۆنیستەیان کوشت کەبەرگی سوپای پۆڵەندییان پۆشیبوو . پاشان هتلەر، ئیزگەکەو بەیاننامەکان و تەرمی کوژراوەکانی وەکو دیارترین بەڵگەی شەڕئەنگێزیی دەوڵەتە

دۆستە دراوسێکەی خستە بەرچاوی گەلی ئەڵمانیاو، ئەمە بوو بەپاساوێك بۆی کەپەلاماری پۆڵەندە بدات. بەکردەوەش سوپای ئەڵمانیا پەلاماری پۆڵەندەی‌داو داگیریکرد.

سێ کەس لەم سیناریۆیە ئاگاداربوون : هتلەر، ئەفسەرەکەو پزیشکێك. دوای ئەوە پلەی ئەفسەرەکە بەرزکرایەوەو بوو بەجێی متمانەی هتلەر، بەڵام پزیشکەکە بەهۆی خزمەتە زۆرەکانی‌و دڵسۆزیی" هتلەر نەیکوشت بەڵکو خستیە شێتخانەیەك هەتا لەئەنجامی بۆردومانێکی هێزە ئاسمانییەکانی وڵاتە هاوپەیمانەکان بۆ سەر بەرلین، کوژرا .

ئەم سیناریۆیە هەر بەپەنهانی مایەوەو تا دوای جەنگ و داگیرکردنی بەرلین لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە، پەردەی لەسەر هەڵنەماڵرا . باخوێنەر سەرنج بدات کەسەد زیندانی ئەڵمانی‌و دەیان هەزار بێتاوان لەگەڵی پۆڵەندەو بەهەزاران سەرباز لەسوپای داگیرکەری ئەڵمانیا، بوون بەقۆچی قوربانی بۆ ئایدیۆلۆجیایەکی تاکەکەسی .جا لەمێژووی جیهانی سیاسیی دوێنی‌و ئەمڕۆدا، دەیان نموونەی تری لەم جۆرە هەبووەو هەیە ...خوای گەورە لەفێڵ و کەڵەکی کەڵەکبازان بمانپارێزێت و گەلی کوردیش لەپیلان و پیلانگێڕان بەدووربگرێت.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی‌و کۆتایی هاتنی دەستەڵاتی هتلەرو نازیستەکان، حکومەتی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی وەك بەریتانیا، ئەمریکا، فەرەنساو رووسیا کەدژی هتلەری نازیست جەنگیان بەرپاکردبوو، رۆڵێکی کاریگەریان گێڕا لەڕووی گۆڕینی سیاسەتی جیهان و ململانێکردن بۆ دەستەڵات سەپاندن و زەوتکردنی سامانی وڵاتانی دنیا. ئنجا ململانێی نێوانیان بەشێوەیەك گەورەبوو تا بەخۆیان وەرگەڕانە دوو خەنیمی سەنگەر لێکگرتووی سەر بەدوو بەرەی دژ: بلۆکی رۆژهەڵات و بلۆکی رۆژئاوا. ئنجا یەکسەر جەنگی سارد لەنێوان ئەم دوو بلۆکەدا دەستی پێکرد، دەزگای K.G.Bی سۆڤیەت و دەزگای (C.I.A) ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەنهێنی‌و بەئاشکرا کەوتنە دژایەتیکردنی یەکتر و لێدانی بەرژەوەندیی یەکتر، لەناوچە جیاجیاکانی جیهان. پاشان پێشبڕکێی خۆچەکدارکردن دەستی پێکرد کەتێیدا هەریەکە لەو دوو بلۆکە هەوڵیدەدا رای گشتیی جیهانی بەلای خۆیدا رابکێشێت و لەهەمانکاتدا خۆی وەکو فریشتە بنوێنێت .

ئەمە لەکاتێکدا هەموو جۆرە چەکێکی قورسی وەکو موشەکی کیشورەبڕو ئەتومدار ئاراستەی چەند ئامانجێکی دیاریکراو کرابوون لەوڵاتانی سەر بەهەردوو بلۆکدا، هەروەها دەزگاکانی راگەیاندن وەك ئیزگەو رۆژنامەو گۆڤارەکان هەمیشە لەکاردابوون، دامودەزگا پەیوەندارەکانی هەردوو بلۆك وایاندەکرد دەوڵەتانی دراوسێی یەکتر پێکدا بدەن ئەویش لەرێی بەکارهێنانی دوژمنایەتی نێوانیان یاخود نانەوەی ناکۆکی‌و دوژمنایەتی لەنێوان وڵاتاندا بۆ ئەو مەبەستە کە لەئەنجامدا جەنگی دوورودرێژی وایان لێدەکەوتەوە شنگی لەهەردوو وڵاتی بەشەڕهاتوو دەبڕی، ماڵ و سامان و توانای ئابووریی بەفیڕۆ دەچوو وخوێنی هەزاران لەرۆڵەکانی دەڕژا، هەموو ئەمەش تەنها لەپێناو تاقیکردنەوەی ئەو چەکانەی کەهەردوو بلۆك لەرێی بەکارهێنانی نوێترین تەکنەلۆجیاو مەترسیدارترین کەرەستەی قەدەغەکراو،

دروستیاندەکرد. تەنانەت هەندێك جار دەبینین لەپێناو پەیداكردنی بازاڕ بۆ ساغكردنەوەی چەك و كەلوپەلە سەربازییەكانیان، ململانێ دەكەوێتە نێوانیان .

دەكرێ بگوترێ مەترسیدارترین چەكێك كەهەردوو بلۆكی نەیار بەكاریان هێنابێت ماددە بێهۆشكەرەكانە وەك حەشیشە، هیرۆین و كۆكایین و چەند جۆرێكی تر لەوانەی لەم دواییانەدا دروستكراون . ئەم ماددانە بەهۆی بازرگانەكانەوە بە ولاتاندا بلاوبوونەوە بۆ وێرانكردنی ژێرخانی هەندێك ولات ئەمەش لەرێی تێكدانی هۆشی لاوانی ولات تا ئاگاداری ڕووداوەكانی جیهان نەبن و لەئەنجامدا لەرووی بیروهۆشی نەتەوەیی‌و نیشتمانییەوە سست بن.

بلۆكی رۆژهەلات برەوی بەم بازرگانییەدا، بەتایبەتی دەوڵەتی چین كەچەندین جۆر رێگەی بۆ بەكارهێنانی ئەم چەكە كوشندەیە خستە گەڕ كە لەسەردەمی ماوەتسی تۆنگدا ئەم كارە بەچاودێریی دەزگای موخابەرات ئەنجامدەدرا . لەكۆبوونەوەیەكی سەرۆكەكانی دەوڵەتە بێلایەنەكان كە لەسالانی پەنجاكانی سەدەی رابردوو لەشاری ئەسكەندەرەییەی میسر بەسترا، سەرۆكی كۆچكردووی میسر جەمال عەبدولناسر بەئاشكرا مەترسیی خۆی بۆ (شو ئان لای)ی سەرۆك وەزیرانی چین دەربڕی لەوەی كەچین لەو شەڕە تێوە بگلێت كەلەنێوان ئەمریكاو فیەتنامدا بوو و لەئەنجامدا چین بەناچاری بكەوێتە بەرەی شەڕەوە لەدژی ئەمریكا . بەرێز( شو ئان لای) لەوەلامدا گوتبووی : حكومەتی چین ئەم مەترسییەی لەبەرچاو گرتووەو خۆی بۆ ئامادەكردووە، ئەوش كەموخابەراتی چینی، مەزراو كێلگەی فراوانی بەتلیاك چاندووە بۆ ئەوەی بەهەرزان پێشكەشی سەربازی ئەمریكایی بكات و بەمە پەكی بخات .

ئەمەی سەرەوە نموونەیەكی رێوشوێنی موخابەراتیی بلۆكی رۆژهەلات و رۆژئاوابوو . لەسالی ١٩٤٦ەوە هەتا ئەمڕۆ، هەرچی شۆڕش و كودەتاو ئەو گۆڕانكارییە سیاسیانەی بەسەر هەندێك دەوڵەتدا هاتووە هەر هەموویان دەرەنجامی ململانێی نێوان بلۆكی سۆشیالیست بوو بەسەركردایەتیی یەكیەتی سۆڤیەت و، بلۆكی سەرمایەداری كەولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا سەركردایەتی دەكرد كە هەموو پیلان و هەنگاوەكان لەلایەن دەزگای موخابەرایەتی ئەو دوو دەوڵەتە زلهێزەوە دادەرێژراو جێبەجێ دەكرا . چونكە كاریگەریی دەزگای موخابەراتی ئەو دوو دەوڵەتە بەهەموو لایەكی جیهان راگەیشت بەتایبەتی دەوڵەتە عەرەبییەكان. دەبینین لەولاتە جیاجیاكانی ئاسیاو ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەستەلاتی ئەمریكاو بەریتانیاو رووسیا و فەرەنسا بەئاشكرا دیارە كەئەم دەوڵەتانە دەستیان لەهەموو كودەتاو شۆڕشێكی جیهاندا هەبووە مەگەر لەپێنج دەوڵەتدا نەبێت كەشۆڕشەكانیان بەخواستی گەل و دژی ویستی هەردوو بلۆك روویاندا ئەوانیش ئەمانە بوون: شۆڕشی میسر بەسەركردایەتیی كۆچكردوو جەمال عەبدولناسر، شۆڕشی ١٤ی تەمووزی سالی ١٩٥٨ بەسەركردایەتیی كۆچكردوو عەبدولكەریم قاسم لەعێراق، شۆڕشی لیبیا بەسەركردایەتیی دۆستی گەلی كورد سەرۆك معمەر قەزافی، شۆڕشی كووبا بەسەركردایەتیی فیدلْ كاسترۆ، شۆڕشی جەزائیر بەسەركردایەتیی بەرەی نیشتمانیی جەزائیر،

ئیتر هەرچی گۆڕانکایەکی تری سیاسیو سەربازی لەجیهاندا روویدابێت ئەوە بەتەنها لەبەرژەوەندیی بەریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادابووە، وەك:

١ـ رووخانی کۆماری کوردستان لەمهاباد (ئێران)و لەسێدارەدانی شەهید قازی محەمەدی سەر کۆماری بەدەستکیسەی (C.I.A) بوو .

٢ـ پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسرائیل بەپلانی بەریتانیاو ئەمریکابوو .

٣ـ دووبەرەکی نانەوە لەکۆریاو هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لەو وڵاتەداو دابەشکردنی بەسەر کوریای باکورو کۆریای باشووردا کە گەلی کۆری هەتا ئەمڕۆ بەدەست ئەو جیاکردنەوەیەوە دەناڵێنێت .

٤ـ کاتێك دکتۆر محەمەد موسەدەق حوکمی ئێرانی گرتە دەست، شای ئێران بەرەو عێراق هەڵهات و پاشان روویکردە ئەوروپا، بەڵام لەساڵی ١٩٥٣ دا جەنەراڵ زاهدی بەپیلانێکی دەزگای (C.I.A) کودەتایەکی سەربازی ئەنجامدا کە بەهۆیەوە شا گەڕایەوە بۆ ئێران.

٥ـ لادان و لەسەرکارخستنی ئەحمەد سوکارنۆی سەرکۆماری پێشووی ئەندۆنیزیا ئنجا دانانی سوهارتۆ لەجێی ئەو، پلانی (C.I.A) بوو .

٦ ـ دەزگای (C.I.A) پلانێکی داڕشت بۆ دابەزاندنی هێزەکانی مارینز(هێزی دەریایی) ئەمریکی لەدوورگەی (ام الخنازير) لەکووبا بۆ رووخاندنی رژێمی حوکمی فیدڵ کاسترۆ بەڵام پلانەکە سەری نەگرت. ئەوکاتە (دالاس) ماوەی چواردە ساڵ و چوارمانگ بوو بەڕێوەبەری ئەو دەزگایە بوو، بەڵام دوای شکست هێنانی ئەو پەلامارە ئاسمانییە دەستی لەکارکێشایەوە. چونکە ئەمە مەرجێکی کادری دەزگای موخابەراتە، ئەگەر لەئەرکێکدا سەرکەوتووبوو ئەوە پلەی بەرزدەکرێتەوە هەروەکو هتلەر کەپلەی ئەفسەرەکەی لەمەڕ نەخشەدانان بۆ داگیرکردنی پۆڵەندەی بەرزکردەوە، خۆ ئەگەر شکستی خوارد ئەوە وەك (دالاس) دەبێت دەست لەکار بکێشێتەوە .

## یەکێتی سۆڤێت( جاران )و کورد

کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ...

نەوە خۆشەویستەکانم ...هەی وارسی سەرشۆڕی ... خوای گەورە سەرکەوتن بکاتە بەشمان و پشتگیریمان بکات بۆ دەسهەڵگرتن لەبەشێکی میراتیی باوباپیرانمان کەئەویش سەرشۆڕیو بێبەشییە کەنزیکەی بیست سەدە لێمان نەبۆوە . سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزن و نەبەردیی گەلی کوردستان کەبەرگریکردو بەم رۆژە گەشە گەیشت، هەروەها خوا رووی دوژمنانمان رەش بکات .

لێرەدا دەمەوێ پێکەوە یادی پوختەیەکی چەند رووداوێکی کوردستان لەدوای جەنگی جیهانی بکەینەوە ئەویش لەدیدوبۆچوونێکی موخابەراتییەوە، هەروەها هەڵوێستی هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەبیر بێنینەوە دەرهەق بەگەلی کوردستان لەپێناو روونکردنەوەی هەڵوێستە سلبییە یەك لەدوای یەکەکانیان بەرامبەر شۆڕشەکانی کورد لەسەردەمی نوێدا .

پێدەچێت پیرەژنێکی کوردی نیشتەجێی کوێرەدێیەکی چەپەکی شاخەکانی کوردستان دوعاو نزای لەلای خوا گیرابووبێت، کەکۆماری کوردستان لەئێران دامەزرا . بەڵام ئەم هەلەی بۆ کورد هەڵکەوت زۆری

نەخایاند، کۆمارە ساوایەکە تەنها یازدە مانگ ژیا. ئەوەبوو ترومان ـ سەرۆکی ئەو دەمەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئاگانامەیەکی توندی کردە سەر ستالین سەرۆکی سۆڤیێتی جاران، تێیدا داوای لێکرد بەزووترین کات هێزەکانی لەئازربێجان بکێشێتەوە، ئەگەر نا، ئەوە هێزە زەمینیو دەریاییو ئاسمانییەکانی ئەمریکا پەلاماری سوپای سووری سۆڤیێت دەدەن کەئەو دەمانە پشتیوانیی لەکورد دەکرد . چونکە دوای روخانی هتلەر، هەردوو بلۆکی جیهانی" لەسەردابەشکردنی جیهان بەسەر چەند ناوچەیەکی دەستەلات لەنێوان خۆیاندا رێککەوتن کە بەپێی ئەودابەشکردنە، ئازربێجانی رۆژئاوا بەر سۆڤیێت دەکەوت . لەو کاتانەشدا کورد (کۆماری کوردستان ـ مهاباد) هاوپەیمانی ئازەربێجان بوو لەدژی دەستەلاتی شاهنشاهی لەئێران، بۆیە بوونی سوپای سووری سۆڤیێتی لەناوچەکەدا پەکی شای خستبوو کەدژی کورد بجووەلیت . بەلام دوای ئەوەی ستالین ملی بۆ ئاگانامەکەی ترومان کەچکردو هێزەکانی سوپای سوور لەئازەربێجان کشانەوە، ئیدی هێزەکانی ئێران" کەرۆژئاوا پشتگیری دەکردن بەریان بۆ بەرهەڵدابوو و پەلاماری کوردستانی ئێرانیان داو شاری مهابادیان داگیرکرد، بەمەش کۆماری مهاباد رووخاو سەرکۆماری قارەمان، قازی محەممەد لەگەڵ ١٢ هاورێیدا لەسێدارەدران .

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێت کە: بۆچی حکومەتی سۆڤیێت پشتگیری لەگەڵی کورد نەکرد؟ بۆچی سۆڤیێتەکان، کوردو قازی محەممەدیان وەکو خاوەن مافێك سەیر نەکرد تا داکۆکی لێبکەن ؟ خۆ بەلانی کەم دەیانتوانی گفتوگۆ لەگەڵ ئەمریکاو دەسەلاتی ئێران بکەن و ئاگربڕێکیان بسەپاندایە کە بەهۆیەوە، پارێزگارییان لەدەسەلاتی کوردی بەکردایە ! کەچی سەربایشی، دەبینین شوێنکەوتوانی ئەو کاتەی بیری ستالیزم و ئەوانەش کەتا ئێستا رچەی ئەو بلۆکەیان بەرنەداوە، سوورن لەسەر ئەوەی گوایە ستالین، کوردستانی لەبەرئەوە تالانفرۆش کرد تا لەرێی بەقوربانیکردنی کەم لەپێناوی زۆردا، پارێزگاریی لەئاشتی جیهان بکات!

بەلام راستییەکە لەواقیع تالترو دژوارترە، چونکە سوپای سوور کە لەئازەربێجانی رۆژئاوا پاشەکشەی کرد تەنها بۆ رازیکردنی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبوو، بەڵکو لەراستیدا رێککەوتنامەیەك لەنێوان ستالین و سەرۆك وەزیران (قوام السلطنة)ی ئێران مۆرکرابوو کە بەپێی رێککەوتنامەکە " ستالین چیترو زیاد لەوە بۆ هەتا هەتایە پشتگیریی گەلی کورد نەکات، ئەمەش بەرامبەر ئەوەی کەئێران، بۆماوەیەکی درێژخایەن نەوت بەرووسیا بدات.

سەیر لەوێدایە کەدوای رووخانی کۆماری مهابادو لەباربردنی خەونی مەزنی نەتەوەیی کورد، (قوام السلطنة) لەرێککەوتنامەکە پەشیمان بۆوە، جا لەکۆبوونەوەیەکی پەرلەمانی ئێراندا گوتبووی: ( بڕوا ناکەم حکومەتی رووسیا گلەیی ئەوەم لێبکات کەپەشیمان بوومەتەوە لەوەی نەوتیان بدەمێ، چونکە لەئێراندا پەرلەمان و یاساو مافی گشتی هەیە، منیش هەرچەندە سەرۆك وەزیرانم، بەلام لەوەندە زیاترم لەدەسەلاتدا نیە کەتەنها یەك پەرداخ نەوت بەرووسیا بدەم .

لێرەدا بەئاشکرا، شکستخواردنی ستالین لەم بازرگانییە دۆڕاوەدا بەدیدەکەین کەچی سەرباریشی، ئەوانەی لەسەر دروستیی سیاسەتەکانی ستالین سوورن، دەڵێن: ئاخر ئەوەی کار نەکات هەڵە ناکات !

خوێنەرانی بەرێز :

رێگەم بدەن پڕکێشی بکەم کەداواتان لێبکەم بەدەم ئەم مەسەلەیەوە بزەیەك بکێشین ! لەگەرمەی ململانێ لەناو کوردستاندا بۆ رووخاندنی کۆماری مهاباد بەپیلانێکی ئەمریکی ـ رووسی ـ ئێرانی، هەروەها بۆ دەستگیرکردنی سەرانی بزوتنەوەی کورد، سەرکردەی کۆچکردووی کورد مەلامستەفا بارزانی توانی لەگەڵ ٥٠٠ کەس لەهاوڕێو لایەنگیرانیدا سنووری ئێران ببەزێنێت و خۆی بگەیەنێتە خاکی یەکێتی سۆڤیەت و لەوێ داوای مافی پەنابەری بۆ خۆیو هاوەڵەکانی بکات، ئەوەش لەو دەستەڵاتەی ئاگاداری وردودرشتی کارەساتەکەو هۆکارو ئەو دەرەنجامانەش بوو کەبوونە مایەی ئەوەی ئەو سەرکردەیەو هاوەڵەکانی، پشت لەکوردستانی ئێران بکەن و هەڵێن .

موخابەراتی K.G.B، هەتا ساتی فرۆشتنی کێشەی کوردو تەسلیمکردنی گەلی کورد بەدەسەڵاتی ئێران، بەردەوام پەیوەندی لەگەڵ کۆماریمهابادو سەرکردایەتییەکەی هەبوو کەمەلامستەفای بارزان کۆڵەکەیەکی بوو، بۆیە شتێکی بەڵگەنەویست بوو کەدەبوایە دەستەڵاتی سۆڤێتی، رێز لەو سەکردەیەی کوردو هاوەڵەکانی بگرێت و وەکو نوێنەرێکی گەلی کوردو سەرکردەیەك پێشوازییان لێبکات . زیاد لەمە، لەسەر دەستەڵاتی سۆڤێتی پێویست بوو وەکو هەرپەنابەرێکی سیاسی کە لەجیهاندا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، مامەڵە لەگەڵ بارزانیو هاوەڵەکانی بکات. بەڵام سۆڤێتیەکان لەبەرئەوەی چاویان بەکورددا هەڵنەدەهات کەببێتە خاوەن قەوارەیەکی سیاسی، هەروەها پابەندبوونیان بەجێبەجێکردنی کوێرانەی ئایدیۆلۆجیاکەیان دەرهەق بەگەلی کورد کە لەگەڵ پرۆسەی پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد یەکینەدەگرتەوە، ئنجا بەهۆی سووك سەیرکردنی گەلێك و سەکردەیەك“ مامەڵەیان بەرامبەر مەلا مستەفای بارزان و هاوەڵەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

دوای چەککردنی مەلامستەفا و ٥٠٠ هاوەڵەکەی، لەمیانەی لێپێچینەوەیەکی ورددا ناویان تۆماکرا، ئنجا بەژمارەی کەم و تەنیا بەسەر شارو شارۆچکەکانی یەکێتی سۆڤێتدا دابەشکران، وەکو دەستبەسەر بێئەوەی گوێ بەباری گوزەران و بژێویان بدرێت کەدەبوایە کارگێڕیەتیی رووسی، مووچەی مانگانە بۆ هەریەکەیان دابین بکات بۆ خەرجی بەرگ و خۆراك. بۆیە مەلا مستەفای بارزان و هاوەڵەوکانی ناچاربوون هەموو جۆرە کارێك بکەن، بۆ نموونە مەلامستەفای سەرکردەی کورد دەستیدایە قەسابیکردن، لەهەندێك بارودۆخی دژواریشدا کەرووی تێکرد ناچاربوو خۆڵڕێژی بکات. ئەمە خۆی لەخۆیدا سووکایەتیکردنی کارگێڕیی ئەو دەمانەی رووسیایە نەك هەر بەسەرکردەی کورد، بەڵکو بەهەموو گەلی کورد، جگە لەوەی ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کەرووسیا هەرگیز نەبوون و ناشبنە پشتیوانی گەلی کورد هەروەکو ئەدەبیاتی سیاسییان بانگەشەی پشتگیریکردنی گەلانی ستەم لێکراو دەکەن یان هەروەکو هەوادارو شوێنکەوتوانیان لەولاتانی رۆژهەلات بەتایبەتیو جیهان بەگشتی، لافی پێوە لێدەدەن . بڕواش ناکەم هەرگیز بیریان لەوە کردبێتەوە ئاوڕ لەمەسەلەی کورد بدەنەوە بەڵکو هەموو چاکەیەکیان بەسەر کوردەوە، دۆستایەتییەکی سەرزارەکییە کەزیانی هەیە نەك سوود .

چـــونکه ئەو بارودۆخە دژوارەی سەکردەی کۆچکردوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا لەوێ بەسەریبرد، تەنها دوای گەڕانـەوەی بـۆ بەغـدا ئنجـا وردەکارییـەکانی ئاشـکرابوو. وابلاّوکرابـۆوە گوایـە سـەرۆك بـارزانی لەیەکیـەتی سـۆڤێتدا پلـەی جەنـەڕاڵی پێـدراوە، هـەروەها لەگـەڵ هاوەڵەکانیـدا لەئـەکادیمیای سـەربازی لەرووسیادا، دەخـوێنن ...بـەلاّم هـەموو ئـەم پڕوپاگەندانـە قسەی پڕوپـووچ بـوون ! چونکە راسـتییەکە دژواربـوو . چـەند دەوڵـەتێکی جیهـان لەئیزگەکانیانـدا ماوەیـەکیان بـۆ بلاّوکردنـەوەی بەرنامـە بـەزمانی کـوردی تـەرخانکردو تـا ئـەمڕۆش ئەمـە بەردەوامـە، بـەلاّم دەبیـنین سـەربارى ئـەوەی پـارتی شـیوعی لەعێراقدا هەیەو پەیوەندییان بەیەکێتی سۆڤێتەوە هەبوو، کەچی هەتا ئێستا نەمانبیزیو نەمانبیست کەرووسیا، تەنها پێنج دەقە لەماوەی پەخشی ئیزگەکەی بۆ زمانی کوردی تەرخان بکات...

بابگەڕێینەوە بۆ باسەکەی خۆمان ... موخابەرات ...

**موخابەرات لەسەرەتای فەمانڕەوایی ئیسلامدا :**

خوێنەری بەرێز ...

مەبەستم لەوەی باسمکردو لەوەش کە لەمەودوا باسیدەکەم، شارەزابوونە لەهەندێك لایـەنی دەزگـای موخابـەرات تالـەو ڕێگەیـەوە بیسەلمێنم ئـەم دەزگایـە، رادەبـەدەر گرنگـە بـەڵکو زیـاد لەمـەش لـەرووی سـەقامگیرکردنی کۆڵەکـەکانی هەردەوڵـەتێك، رەگـەزێکی بنەڕتییـە ئـەویش ئەگـەر خـەڵکانێکی دەسـتپاك بەرێکوپێکی بەڕێوەی بەرن .

پێغەمبـەری خـوا (د.خ) بـۆ زانینـی راسـتییەکان و پەردەهـەڵماڵین لـەرووی شـتە پەنهانـەکان، لایـەنی موخابـەراتی پـشتگوێ نەخـستووە، هەمیـشە بایـەخی بـەوەداوە کەچـاودێری هـەبێتو بەناوچـەکاندا بلاّویـان بکاتـەوە، هـەروەها بۆ پـەیبردن بەراستییەکان پیـاوی وردبین و کارامـە هەڵبـژێرێت ئنجا لەسـەر راپۆرتی ئەوانە، بڕیار لەسەر کاری مەترسیدار بدات کەپەیوەندی بەپارێزگاریکردن لەئاین و گەیەنـەری پەیامی ئاسمانی هەیە.

دەبیـنین لەشـەڕی خەندەقدا، پێغەمبـەری خـوا(حذیفـة بـن الیمـان)ی هەڵبـــژاردوفەرمانی پێـدا بـاری دوژمـن بـەوردی هەڵسەنگێنێت و هەواڵەکـە بێنێتـەوە کەسوپای کافرەکـان بـەنیازبوون پـەلاماری شـاری مەدینە بدەن، ئنجا لەخوا پاڕایەوە کەحوزەیفە لەگەڵ خۆیدا بەبەهەشتی بەرین شادبکات... خـوا هـەموو لایەکمان بەبەهەشت شادبکات.

هەرچەندە لەسەرەتای بلاّوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا دەزگایەکی موخابەرات بۆ راپەڕاندنی ئەو جۆرە کارانە نەبوو، هەروەها خەڵکی شارەزاش لەم بوارانەدا نەبوو، بەلاّم پێغەمبەری خوا (د.خ) بـەلێهاتوویی‌و بیرە تیژەکەی خۆی خەڵکی گونجاوی بۆ هەموو کارێك هەڵدەبژارد. پێغەمبەر، لەبەرئەوەی نیـازی زانینـی توانـای سـەربازیی دوژمـن بـوو وای بەپێویـست زانـی کـەبۆ پەیـداکردنی ئـەم جـۆرە زانیارییانـە بایـەخ بەلایەنی هەواڵدۆزی (استطلاع) بدات، چونکە دەبوایە هەواڵی ئەو دوژمنانەی بزانیایە کەهێزەکانیان بـۆ لەداونانی خـودی خـۆی ئنجا بێهێزکردنی بانگەوازەکـەی تـەیار دەکـەن. پێغەمبـەر تـەنها دەیویـست ئـەو هەوالاّنــە بزانێــت نــەك زیــاتر، چــونکە بــەپێی دەقــی ئــەو ئایەتــەی قورئــانی پــیرۆز کــاری دەکــرد

کەدەفەرموێت:﴿ ولا تجسسوا ولا يغتب بعضكم بعضاً﴾.واتە: پێغەمبەر (د.خ) پرۆسەی سیخوڕیکردن بەسەر ئەو دوژمنانەی مەترسییان بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان لێدەکرا، حەلاڵکردبوو، تەنانەت ئەو مەترسییانەی روویاندەکردە ریزی موسڵمانان نەکا بکەونە بەر کاریگەریی پارەو ماڵ و سامان، چونکە خوای گەورە کەفەرمویەتی : ﴿وخلق الانسان ضعيفاً ﴾ ئەوە کەسی لەوە هەڵنەبواردووە کەدەشێ لەو ڕووەوە

کاری تێبکرێت و بەپارە و سامان لەخشتە ببرێت .

دەبینین کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) لەسەر کەڵەکە کردنی ماڵو سامان، ئەبو مووسای ئەشعەریی لە ویلایەتی شاری بەسرە خست هەروەها ئەبو هورەیرەی لەویلایەتی بەحرێن خست هەرچەندە ئەوانە، ئەو ماڵو سامانەی دەستیان کەوتبوو لەگەڵ (بيت المال)دا کردیان بەدوو بەشەوە، بەڵام ئەمە خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کەئەم فەرمانداارانەی سەرەتای مێژووی حوکمڕانی ئیسلام، کەوتبوونە بەر کاریگەریی پارەو سامان کۆکردنەوەو لە هەمان کاتیشدا حەزرەتی عومەر چاودێری بەسەریانەوە هەبووە.

کتێبی (مێژوو)ی لەمەڕ مێژوونووسی ئیسلامی تەبەری، دەریدەخات کەدەزگای سیخوڕیکردن لەپێناو پاراستنی ئاسایش و ئارامیی دەوڵەت، لەمێژووی ئیسلامدا لەسەردەمی موعاویە کوڕی ئەبو سوفیان دامەزراو ئەوانەی ئەو دەزگایەیان بەڕێوەدەبرد بە(اصحاب الشرطة) ناودەبران.

ئنجا کاتێك ئەمەوییەکان دەسەڵاتی حوکمی ئیسلامییان بەتەواوەتی گرتە دەست، ئەم دەزگایەیان پەرەپێداو دەوڵەت زیاتر بایەخی پێدا، ئەویش لەرێی پشتبەستن بەپرنسیپێکی گرنگ بۆ کارکردن لەچوارچێوەی ئەم دەزگایەداکە: کارمەندانی دەزگاکە یەکتر نەنانسن و لەخۆیان سەرووتریش نەناسن، بەمەش هەریەکەیان بەرپرسیاردەبوو لەپلەکەی خۆی و لەهەمانکاتدا هەمیشە لەو چاودێرە دەترسا کەبەسەریەوەیەتیو نەشیدەناسی، ئنجا ئەوەی لەخوا نەترسایەو ناپاکی بەکردایە، دادگا سزای دەدا.

دەگێڕنەوە ئەبو جەعفەری مەنسوور هەمیشە دەیگوت: ( چەندم پێویست بەچوار کەسە لەناو دەرگامدابن کە لەخۆیان دەستپاکتر نەبێت...) گوتیان: (ئەوانە کێن؟) گوتی:ئەوانە کۆڵەکەی فەرمانڕەوایەتین، هەروەکو چۆن چارپا بەبێ چوار ئەستووندەگ نابێت، ئەوچوار کۆڵەکەیەش ئەمانەن:

١ـ قازییەك لەترسی خوا، لەهیچ نەترسێت.

٢ـ (صاحب الشرطة) یەك کەبێدەسەڵات بەسەر دەسەڵاتداردا سەردەخات.

٣ـ باجسێنێك لەشت ورد دەبێتەوەو ستەم لەهاووڵاتیان ناکات.

٤ـ چوارەم ...لێرەدا خەلیفە سێجار پەنجەی خۆی دەگەزێت و لەهەموو جارێکدا دەڵێ( ئاخ...)...

پێیان گوت: ئەی میری ئیمانداران،چوارەم کەس کێیە؟

گوتی: هەواڵدۆزێك کە بەڕاستی لەسەر ئەوانە دەنووسێت( بڕوانە:تاريخ الطبري).

دەڵێن: ئەوەی شایەدی بەچاودێتە بەدیدەکات، بێئاگا بەدی ناکات.

ئەوەی ئەبو جەعفەر هەوڵیدا کەدەستی بکەوێت چوارچێوەی هەردەوڵەتێك و بناغەی هەرقەوارەیەکی پتەوبوو. چونکە قازی(دادوەر)ی دادپەوەر کە بەپێیفەرمانی خواو یاسا حوکم بکات، هەروەها لێپرسراوی ئاسایش(صاحب الشرطة) کەپارێزگاریکردنی هاوولاتییانی لەخراپەو گەندەڵی لەئەستۆدایە" ئەمانە رووکاری دەوڵەت و وێنەی ڕاستەقینەی ئایدیۆلۆجیای حکومەتن لەبەردەم گەلدا. ئنجا وەزیری دارایی‌و ئابووری، ڕێکخەری ولات‌و داینەمۆی چالاکی‌و گەشەسەندنی دەوڵەتە ڕێبەپێی دابینکردنی خزمەتگوزاریی تەندروستی‌و فێرکاری و پەروەردەیی. چوارەم کەس خودی بەڕێوەبەری موخابەراتە کەدووره لەلادان و گەندەڵی‌و لەلایەن سەرۆکی دەوڵەتەوە چاودێری دەکرێت کەسیاسەتی دەوڵەت بەپێی پەیڕەوو پرۆگرامێکی دروست و بناغەگەلێکی زانستی بەڕێوەدەبات لەپێناو مەبەستێکی بالا کەئەویش خزمەتی مرۆڤ و بەتایبەتی دەوڵەت‌و گەلە. شایەنی باسە ئەو هەوێنەی دەبێت لەهەموو بەڕێوەبەرێکی دەزگای موخابەرات‌و سەرۆك دەوڵەتێکدا هەبێت " دڵسۆزییە کەدەبێ خەڵکی تریشی موتووربە بکرێت.

هەموو دەوڵەت و ولاتێك دەزگای موخابەرات بەکاردێنێت، ئەوەی هەیە لەڕووی پێکهێنان یاخود ناونانی دەزگاکە، لەدەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر جیاوازی هەیە. بەلام گرنگ ئامانجی دەزگاکەیە بەشێوەیەکی گشتی کەئەویش پاراستنی دەستەلاتە، هەروەها پارێزگاریکردنی ئاسایشی ولات و خزمەتکردنی گەلە...بەلام ماشەڵلا لەگەورەیی خوا، دامودەزگا ئەمنییەکانی عێراق لەڕۆژی دامەزراندنیانەوە هەتا ئەمڕۆ، لەچوار شت بەرپرسیارن:

١ـ پاراستنی سەرۆکی دەوڵەت لەهەر پیلانێکی دەرەوە یان ناوەوە کەبۆ لەناوبردنی ئەو یان دەسەلاتەکەی دەگێڕدرێت، هەروەها لەناوبردنی ئەوانەی مەترسییان بەرامبەر سەرۆك لێدەکرێت با ئەو مەترسییە بەڕێژەی ١٪ یش بێت.

٢ـ کارکردن بۆ سەقامگیرکردن‌و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرۆك کەهەرچەندە پێچەوانەی یاسان، بەلام وتەو راوێژەکانی بەدەقی یاسا لەقەڵەم دەدرێن، ئنجا بڕیاردانی سزا بۆ ئەو لێپرسراوە حکومی‌و حزبییە هەروەها بۆ ئەو هاوولاتییەی کەئەو فەرمانانە بەتەواوەتی (١٠٠٪) جێبەجێ ناکات یان لەجێبەجێکردنیاندا کەمتەرخەمی دەکات.

٣ـ سەرکوتکردنی هەموو گەلی عێراق. لەم رووەوە شاخەکانی کوردستان و نێوان رووباری دیجلەو فورات لەناوەڕاستی عێراق هەروەها زۆنگاوەکانی باشووری عێراق، شایەدی لەسەر دڕندایەتیی ئەم دەزگا تۆقێنەرە دەدەن.

٤ـ داهێنانی نۆژەنترین رێوشوێن بۆ قەلاچۆکردنی گەلی کورد لەڕووی ڕەگەزەوە هەروەها گۆڕینی واقیعی دیمۆگرافی کوردو لەناوبردنی سیمای کەلەپووررو کەلتوری کوردی.

دامودەزگا موخابەراتییەکانی دەوڵەتانی ناوچەکە وەکو تورکیا، سووریاو ئێران هەمان رچەیان گرتەبەر بەلام بەرێوشوێنێکی جیاواز یاخود سووکتر.

ئەوانیش توندوتیژیی و پرۆسەی چەوساندنەوەو سەرکوتکردنی گەلانی خۆیان بەگشتیی و لەدژی گەلی کورد بەتایبەتی پیادەکرد. جا هەروەکو لەبەشەکانی کتێبەکەم ( کورد دوژمنی خۆت بناسە)دا باسمکردووە، ململانێی و ناکۆکی لەنێوان ئەم دەوڵەتانە هەرچەند توند بێت بەڵام لەئاست لەناوبردنی گەلی کورددا کۆك و تەبان، ئەگەر پەیوەندیی دیپلۆماسی لەنێوانیشیاندا بپچڕێت یان ئاڵوگۆڕی بازرگانییان نەمێنێت ئەوە ئاڵوگۆڕی زانیاریی و داهێنانی ڕێوشوێنی تایبەت و تاقیکردنەوەی نوێ بۆ لەناوبردنی گەلی کوردو سەرکوتکردنی شۆڕش و بزوتنەوەکانی، هەمیشە لەبرەودایەو ڕێگەی هاتوچۆکردنی یەکتریان لێناگرێت...

مرۆڤ بەچی مرۆڤە؟ یا ئەوەیە لەخواو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی دەترسێت، یا لەسزای یاسایەکی دادپەوەر یا لەشەرعێکی مرۆیی دەترسێت کەئەقڵێکی هۆشمەند دایڕشتووە وەکو یاساکانی حەمورابی لەسەردەمی کۆندا، یان بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان یان کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخ گەلاڵەی کردووە.

ئەم یاساوڕێسایانە بەری ڕێگە لەمرۆڤ دەگرن کەکاری خراپ و دژوار
نەکات... بەڵام چاوەڕێی چی لەکەسانێك دەکەیت کەولاتێك بەڕێوەدەبەن و دەزگای موخابەراتیان لەژێردەستدایە بەڵام خۆیان بڕوایان بەخواو کتێبە ئاسمانییەکان نییە؟ کەسانێك دەستی دادو یاسا پێیان ڕاناگات و کەسیش نازانێت ڕەچەڵەك و بنەچەیان چییەو ئەو فێرگەیەی تەواویانکردووە نەروناکی بەخۆیەوە بینوە نەفریشتە چۆتە ناوی...دیارە دڕندەیی و بێبەزەییایەتیی و زۆروستەم، خەسڵەتی دیاری ئەم جۆرە کەسانە دەبێت.

بەکورتی، مافی هاووڵاتیبوونی کورد لەهەرلایەکی خاك و نیشتمانی خۆیدا بێت پارێزراو نییە، چونکە بەهاووڵاتیی پلە دوو لەقەڵەم دەدرێت و دەبێت لەبۆتەی نەتەوەی تورك یان فارس یان عەرەبدا بتوێتەوە تابژی، خۆ ئەگەر لەوەندە زیاتری ویست ئەوە دەبێت خاك و شەرەفی خۆی بفرۆشێت و ببێت بەسیخوڕ... ئەمەش سەرەتای لەناوچوونیەتی. خۆئەگەر کوردێکی سەربەرزو نیشتمانپەروەرێکی پاك بێت ئەوە زیندان و ئەشکەنجەدان و دەردیسەری لەپێشیەتی.

ڕێگەچارەی سێیەم هەڵاتنە بۆ هەندەران، بۆ دەرەوەی وڵات تاکەمێك لەمافەکانی مرۆڤی دەستبکەوێت، ئەمەش ئەگەر خوا بۆی ڕێکخست و لەدەریا نەخنکا یان بەگوللەی پۆلیسی سەر سنوورە نێودەوڵەتییەکان نەکوژرا، ئنجا کەدەستگیردەکرێت بەنابووتی سنووڕداش دەکرێتەوە، ئەم هەڵاتنەش تەنها لەتوانای خەڵکی پارەدارە...

خوێنەری خۆشەویست:

باپێکەوە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوەو شتێك دەربارەی مێژووی خەباتی نەپساوەی گەلی کوردستان بزانین.

مێژوونووسان، زۆر بەدەگمەن" دەشتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم تائێستا
باسی تێکشکانێکی سەربازییان تۆمارنەکردووە کەبووبێتە مایەی ڕووخان یان لەدەستدانی دەسەڵاتێکی کوردی، یان باسی هەوڵێکی کوردییان کردبێت بۆ ڕزگاربوون لەزۆروستەمی گەلانی

دراوسێ لەنزیکەی(٢٠٠٠)ساڵ لەمەوبەرەوە، واتە لەو رۆژەوە کەحکومەتی میدیای کوردی رووخاوە. هەموو ئەو نسکۆیانەی هاتوونەتە رێگەمان و بوون بەهۆی زیان پێگەیاندن و تێکشکانی سیاسیمان هەروەها لەدەستچوونی چەندین هەلی زێرین بۆ سەربەخۆییمان و بنیاتنانی ئیدارەیەکی کوردی" هەموو ئەمانە لەسۆنگەی فاکتەری سیاسی بوون.

بۆ سەلماندنی راستیی ئەو رووداوانە باسی دو لەشکرکێشی سەربازی دێنمەوە کە لەمێژوودا کراونەتە سەر کوردستان و سەرچاوە مێژووییەکان باسیانکردووە. یەکەمیان لەشکرکێشییەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنییە کەمێژوونووسان نەبەردیی گەلی کوردیان لەبەرنگاریکردنی سوپای ئەسکەندەری مەکدۆنی تۆمارکردووە کاتێك ئەوهێزانە بۆ گەیشتن بەخاکی ئیمپراتۆریەتی فارس، بەکوردستاندا تێپەڕبون و چۆن ئەسکەندەری مەکدۆنیو سوپا زەبەلاحەکەی تووشی زەرەروزیانێکی گەورەی ماڵیو گیانی بوون لەسەردەستی شەڕڤانانی کورد ئەوەش هەر لەسۆنگەی ئەوەی کەکورد نەیویستووە سوپایەکی داگیرکەر بەخاکیاندا گوزەربکات با نیازیشی نەبووبێت زیانیان پێبگەیەنێت. بۆ کوردیش ئەوەندە شانازییەی بەسە کەسەرکردەیەکی بەناوبانگی یۆنانی وەکو ئەسکەندەری مەکدۆنی، لەیادداشتەکانیدا بەبوێریو قارەمانیی گەلی کوردستاندا هەڵبدات.

لەشکرکێشیی دووەم لەسەردەمی فتووحاتی ئیسلامیدابوو بەسەرکردایەتیی یاوەری پایەبەرز سەعد کوڕی ئەبو وەقاص (ر.خ) کەئەویش رووبەڕووی بەرگریکردنێکی توندی وەها بۆوە کە شەڕەکانیدا دژی گەلانی تر، نەیدیبوو.

شایەنی باسە کەگەلی کورد لەبەرئەوە نەبوو نەهاتە ریزی ئیسلام کەلەبەردەم سوپای ئیسلامدا تێکشکابێت یاخود لێی ترسابێت، چونکە چەندین گۆڕی یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ) لەخاکی کوردستاندا هەن کەنیشانەی ئازایەتیی کوردن و بەڵگەی شەڕکردنیانە دژی سوپای ئیسلام، شەڕی جەلەولا لەکوردستانی عێراقدا دیارترین بەڵگەی ئەو بەرەنگاریکردنەیە، بەڵکو کورد لەباوەڕی تەواوی بەوەی کەئاینی ئیسلام ئاینێکی تەواوی بێکەموکوڕییە، بوو بەئیسلام. لەم بارەیەوە کتێبە پەیوەندارەکانی مێژووی ئیسلام ئاماژە بەوە دەدەن کەوەفدێکی کورد بەسەرۆکایەتیی (جابان ـ گاوان) ی کورد سەردانی خودی پێغەمبەری کردووەو ئیسلامبوونی خۆی و گەلی کوردی لەحزووری پێغەمبەری خوادا راگەیاندووە ئەمەش پێش ئەوەی فتووحاتی ئیسلامی دەست پێبکەن.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە تائێستا فاکتەری سیاسی، هۆکاری سەرەکیبوو بۆ پێکنەهێنانی قەوارەی کوردی نەك فاکتەری سەربازی. دەبینین کاریگەرترین چەکێك کەئیمپراتۆریەتی فارس و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەدژی کورد بەکاریان هێنابێت سیاسەتی (پەرت بکە ـ زاڵ بە)بوو. بەدرێژایی ٥٠٠ ساڵی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان، ئەمانە بەردەوام و بەهەمو رێگەیەك هەوڵیاندا میرنشینە کوردییەکان لەناوبەرن، ئەوەش یان لەرێی تواندنەوەی ئەو میرنشینانە لەناو ئاینی ئیسلامدا وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی کەسەرۆکەکەی خەلیفەی پێغەمبەری خوایەو دیارە بەگوێکردنی خەلیفە ئەرکی سەرشانەو ملنەدان بۆ فەرمانەکانی گومڕایی (ضلالة) یە، کەئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە گومڕاییکردنێکە

شۆڤێنیستە عەرەبەکان و هەندێك لەوانەی لەئیسلام تێنەگەیشتوون و بەئیسلامییە توندڕەوەکان دەناسرێن، پێڕەویدەکەن. ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری خوا لەم جۆرە کردەوانە بەرین، دیارترین نموونەش بۆ ئەمە یاوەری ڕێزداری پێغەمبەر، سەلمانی فارسییە(ر.خ). جا هەرچەندە پێغەمبەری خوا(د.خ) دەیگوت: ( سەلمان سەر بەئالی بەیتە)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بە (سەلمانی فارسی) ناوی دەبرد، واتە پێغەمبەری خوا، نکوولی لەڕەگەزی فارسیی یاوەرەکەی نەدەکرد. زۆر نموونەی تریش لەم بارەیەوە هەیە.

شایەنی باسە کەسادەوساکاریی مرۆڤی کوردو پابەندبوونی بەئاینی ئیسلامەوە، هەرچەندە تەواویش لێی حاڵی نەبووە، ئەمە ڕێگەی بۆ فارس و تورك خۆشکرد کەکورد بۆ مەبەستی خۆیان بەکاربێنن. دەبینین ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، سوننەی کوردی هاندەدا لەشیعەی کورد بدەن. ئەم ململانێو شەڕو پێکدانانە ناکۆکی زۆرو توندیان لەنێوان میرنشینە کوردەکان دروستکردو وایانکرد خوێن بکەوێتە نێوانیان، کەجاروباریش لەبری فاکتەری مەزهەبی ئاینی، فاکتەری تەماع بەکاردەهێنراو زۆربەی شەڕی نێوان فارس و تورك، کورد لەپێشی پێشەوەی سوپای شەڕکەردابوونە.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانیو تێکشکانی ئەڵمانیا بەرامبەر هێزی هاوپەیمانانی ئەوسەردەمە، ویستی خوا وابوو کەدڵی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان نەرم بێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی گەورەی کوردی کەپایتەختەکەی یا شاری(ئورفە) بێت لەتورکیا، یان شاری مووسڵ. ئەو دەوڵەتە کوردییەی کەتۆبۆگرافیاو دیمۆگرافیاو جلوبەرگ و زمانی دانیشتوانەکەی هەروەها مێژووەکەی" هەموو ئەمانە لەبەردەم خوا شـأیـەدی دەدەن کە لەگەڵ و وڵاتانی دەوروبەری جیاوازەو خاوەنی مافێکی پێشێلکراوەو تەنها پێویستی بەدانپیانێکە هیچیتر.

بەڵام بەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا، لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان، لەبڕیاریان سەبارەت بەپێکهێنانی دەوڵەتی کوردی پەشیمان بوونەوەو پرۆژەکەیان بەجارێك هەڵوەشاندەوەو دەستیانکرد بەپشتگیریکردنی مستەفا کەمال ئەتاتورك بۆ دامەزراندنی کۆماری تورکیاو ڕووبەڕووی کورد وەستان. تەنانەت سەرکردەی شۆڕشی بەڵشەفیو دامەزرێنەری پارتی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێتی جاران، لینین، پشتگیریی پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی نەکردو پشتی مستەفا کەمال ئەتاتورکی گرت و لەسەرکوتکردنی گەلی کورددا هاوکارییکرد. بەمەش بلۆکی سۆشیالیست، دەستی خستە ناو دەستی بلۆکی سەرمایەداری ئەوروپیو هێزی سەربازیی ئەمریکییەوە بۆ فرۆشتنی گەلی کورد لەبازاڕی بەرژەوەندییە سیاسییەکاندا بە کۆیلەسێنی تورك و فارسو عەرەب و ...ئەوەیان پشتگوێ خست کەژمارەی گەلی کورد لە٤٠ ملیۆن کەس زیاترە.

لەراستیشدا چەندیەتیو چۆنایەتیی بەرژەوەندیی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بۆ ڕێگەگرتن لەپێکهێنانی دەوڵەتی کوردیو بەرەنگاریکردنی پرۆژەکە، هەرچییەك و هەر چۆنێك بووبێت ئەوە ناگاتە گەورەیی ئەو تاوان و مەرگەساتەی بەسەر گەلی کوردیان هێنا لەهەشتا ساڵ لەمەوبەرەوە هەتا ئەمڕۆ. لەو بڕوایەشدام کەئێستا ئەوان هەستیان بەهاوکێشەو لێکدانەوە هەڵەکانیان کردووە، زیاد لەوەش دەتوانم سوێند بخۆم

کەدامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لەسەروبەندی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی رۆڵی سەرەکیی دەبوو بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لەناوچەکەدا چونکە تەنها دەسەلاّت و قەوارەی کوردییە کەدەتوانێت بەر لەو نەتەوەو گەلانەی دراوسێ بگرێت کە ئاژەوەگێڕن و ئارەزووی بلاّوکردنەوەی تیرۆریان هەیە لەجیهاندا.

لە١٩١٩/٥/٢٣ دا مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید هەوڵیدەدا دەوڵەتێك بۆ کورد دامەزرێنێت، بەلاّم کاتێك بەریتانییەکان پلانیان بۆ پێکهێنانی حکومەتی نوێی عێراق داڕشت، لە٧/حوزەیران/١٩٢٠دا بزوتنەوەی کوردییان بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموود لەناوبردو کوردستانی باشووریان بەدەوڵەتی تازە پێکهێنراوی عێراق لکاندو گەلی کوردیان بەدەسەلاّتی نوێی عێراق فرۆشت بەبێ ئەوەی پرس بەگەلی کوردستان بکەن کەئایا بەم بەکۆیلەکردنەی گەل و خاکی کوردان، رازیدەبن یان نەء؟

بێگومان کۆیلە پرسیار ناکات... ئەوەندەی هەیە دەفرۆشرێت و دەکڕدرێت...جا دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ گەلی کورددا کرد، پرسیارەکەش لێرەدا ئەمەیە: بۆچی ئەوها کوردیان هەڵسەنگاند؟. ئایا ئەو دەوڵەتە زلهێزانە، لەسەر بەکۆیلەکردنی گەلان راهاتوون یاخود چی؟

بەریتانیا دوای ئەوەی بڕیاریدا دەوڵەتی عێراق دامەزرێنێت لێنەگەڕا هیچ جۆرە کۆسپێك بەری رێی ئەو پرۆژەیەی بگرێت. لێرەدا حکومەتی کوردیی شێخ مەحموودی حەفید لەسلێمانی، کۆسپی بەر رێگەی ئەو پرۆژەیە بوو. ئیتر شەڕ لەنێوان سوپای نیزامیی ئینگلیزو هێزی عەشایەری کوردی بەسەرکردایەتیی شێخ مەحموود لەدەربەندی بازیان دەستی پێکردو لەئەنجامدا، بەهۆی نابەرابەریی هێز، هێزەکانی شێخ مەحموود دوای قوربانیدانێکی زۆر، تێکشکان و شێخی قارەمان دوای بەرەنگاریکردنێکی پاڵەوانانە، بەبرینداری لەپاڵ تاشەبەردێکدا دەستگیرکرا کەئەمڕۆ ئەو بەردە بە( بەردە قارەمان) ناوی دەرکردووەو بەئاسەوارێکی پیرۆزی مێژوویی دەژمێردرێت. پاش ئەوە مەلیکی کوردستان درا بەدادگایەکی سەربازی، ئەفسەرێکی ئینگلیز دەستیکرد بەدادگاییکردنیو چەند تۆمەتێکی دایە پاڵ بۆ ئەوەی تاوانباری بکات و حوکمی لەسێدارەدانی بدات. ئەوەبوو تۆمەتی سەرکردایەتیکردنی گروپێك چەتەی چەکداری دایە پاڵ کەکارو کردەوەیان کوشت وبڕو جەردەییو دەستدرێژکردنە بۆ سەر شکۆو سەروەریی پاشای عێراق و پەلاماردانی سوپای ئینگلیز گوایە ئەم سوپایە لەهەوڵ و کۆششدابوو بۆ سەقامگیرکردنی ئارامیو ئاسایش لەناوچەکەدا.

شێخ مەحموود بەوپەڕی ئازایەتییەوە بەرپەرچی ئەو تاوانە پووچەلاّنەی دایەوەو رەخنەی لەودادگاییکردنە ستەمکارانەیەی ئەوان گرت لەگەڵ درۆودەلەسە بێبناغەکانیان، هەروەها رایگەیاند کەئەو، خاوەنی مافێکی شەرعییە لەوەی دەیکات چونکە بەرەزامەندیی گەلی کوردستان و بەپێی راپرسییەکی جەماوەری بۆتە مەلیك. ئنجا لەناکا، زۆر بەتوندی پەڕۆیەکی پێچراوی دەوری قۆڵی دەکاتەوەو کاغەزێکی قەدکراوی لێ دەردێنێت. هەروەکو لەکوردستانیشدا باوە، کاغەز قەدناکرێت و بەقۆڵەوە نابەسترێت مەگەر زۆر خۆشەویست یان پیرۆز بێت. کاغەزەکە دەقێکی تۆما ولسنی سەرۆکی ئەمریکی تێدا تۆمارکرابوو کەساڵی ١٩١٧ دەرچووبوو، لەچوارده برگە پێکدەهات دەربارەی

بەرقەراکردنی ئاشتی لەجیهاندا، دووەم برگەی بڕیارە جاڕنامەکە پەیوەندیی بەنەتەوەی کوردەوەبوو کەجەختیدەکرد لەسەر دانی مافی تەواو بەگەلی کورد وەك هەرگەلێکی تری جیهان.

شێخ مەحموود بەدەرخستنی ئەم بڕیارەی سەرۆکی ئەمریکی بەو شێوەیەو لەوکاتەدا، هەروەها هەڵوێستی قارەمانانەیو پلەوپایەی لەلای گەلی کورد بوونە مایەی ئەوەی حوکمەکەی کەم بکرێتەوەو سزای لەسێدارەدانی لەسەر هەڵبگیرێت. سەرباریشی حکومەتی بەریتانیا نەك هەر دانی بەمافی رەوای گەلی کورددا نەنا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی بەڵکو، بەزەبری چەك رووبەڕووی شۆڕشی چەکداریی کورد وەستاو بوو بەمایەی ئەو دەردیسەریەی هەتا ئەمڕۆ کورد بەدەستیەوە دەناڵێنێت. لێرەدا بۆیەکا ئەم مەرگەساتە مێژووییە بەبیر مرۆڤی کورد دێنمەوە تابۆ هەتاهەتایەو نەوە دوای نەوە یادی بکەنەوە.

دیارە ئەم هەڵوێستە هیچ دادپەروەرییەکی تێدانەبوو، روخاندنی حکومەتێکی کوردی کە لەخاکی کوردستاندا دامەزرابێت و بەپیلان و فەرمانی بەریتانیای مەزن، کوردستان بخرێتە سەر عێراقی عەرەبی، ئەمە دوورە لەدادپەروەرییەوە.

هەروەها دانانی مەلیك فەیسەڵی یەکەم وەکو پاشایەك لەعێراقداو دان نەنان بەمەلیك مەحموود وەکو مەلیکی کوردستان، ئەمیش دادپەروەری نییە، مەلیك مەحموود کە بەبەراود لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ لەرووی پلەوپایەو دەسەلات و کەسایەتییەوە لەئەو کەمترنەبوو، جگە لەوەی شێخ مەحموود لەکۆڕوکۆمەڵی نێودەوڵەتیو سیاسیدا لەمەلیك فەیسەڵ ناودارترو ناسراوتربوو. بەلام بەریتانیا پاساو بۆ ئەم کردەوەیەی ناهێنێت.

لێرەدا نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت نەوەی ئێستای بەریتانیاییەکان بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە دان بەو کردەوە ناڕەوایەی باوباپیرانیاندا دەنێن کە هەڵەیەکی گەورەیان کردووە. شایەنی باسە کە لەبەرگی سێیەمی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەدوورودرێژی وتووێژی بەرپرسێکی ئیدارەی نوێی بەریتانیام هێناوەتەوە کە لەگفتوگۆیەکی لەگەڵمدا، دانی بەو هەڵە گەورەیەی باوباپیرانیدا ناوە کەکاتی خۆی دەرهەق بەگەلی کورد کردوویانە.

قسە دێت و دەڕوات ئنجا سەر لەنوێ دەگەڕێینەوە سەر پرسیارە سەرەکییەکەمان کەئایا بەرەی زلهێزو زاڵدەستی جیهان، لەمیانەی وەستانیدا رووبەڕووی ئیرادەی گەلی کوردستان و شەرعیەتدان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، چی دەوێت؟

هەروەکو لەوەوپێش باسی کردەوەی بەریتانیای مەزنم لەگەڵ شێخ مەحموود کرد کەحکومەتی کوردیی رووخاند، ئنجا دروستکردنی سەدام حسەینی ئەمڕۆ کە لەگۆڕەپانی سیاسیدا چیدەکات کە بەملیۆن خەڵکی عێراق و بەتایبەتی گەلی کورد لەدەست زوڵم و زۆرو ستەمی دەناڵێنن.

لەبەرامبەریشدا کردەوەی ئەمریکا لەسەردەمی سەرۆك ترومان کاتێك کۆماری مهابادی رووخاند ئنجا دواتر کۆماری ئیسلامیی لەئێراندا دروستکرد لەگەڵ رۆڵی ئەم دەوڵەتە لەپشتگیریکردنی تیرۆر لەجیهاندا. بەڵام ئەوەی جێی داخە، ئەو قەڵەمەی کەسەرۆکی ئەمریکی ـ ترومان فەرمانی رووخاندنی کۆماری مهابادی پێئیمزا کرد کە لەئەنجامیدا قازی محەمەدی سەرکۆماری مهاباد لەسێدارەدرا، هەمان

قەڵەمی وەکو دیارییەکی مێژوویی پێشکەشی حکومەتی ئیسرائیل کرد، ئەویش دوای ئەوەی هەر بەو قەڵەمە مافی ئیسرائیلی تۆمارکرد بۆ راگەیاندنی دەوڵەتیان لەخاکی فەلەستین.

رێککەوتننامەی شوومی جەزائیر (ئاداری ١٩٧٥) بەئاگاداریو پلانی (C.I.A)بوو، ئەنجامدەری پیلانەکەش پیاوێکی خۆیان بوو (مەلامستەفا سەرکردەی شۆڕشی کورد) کە بەداخێکی زۆرەوە دەڵێم ناوبراو شایەنی ئەو پلەو پۆستە نەبوو کە لەئەنجامی چەند هۆکارێکی دەرەکی پێی بەخشرا (لەسەربەرگی کتێبەکەم: کورد دوژمنی خۆت بناسە، باسمکردووە) چونکە هەر ئەوەندەی مەلامستەفا لەیەکەم دیداریدا چاوی بەهەنری کیسنجەر کەوت ئیتر پشتی لێکردەوەو ئیرادەو بەرژەوەندییەکانی دەزگای (C.I.A) ی لەبەرچاو نەگرت و ئەوەی لێکنەدایەوە کەئەو بەرژوەندییانە لەسەرووی بەرژەوەندیی گەلانی جیهانەوەن، بۆیە مەلامستەفا خۆی بۆ هیچ ئەنجامێك تەیار نەکرد.

ئنجا سەرلەنوێ رووداوە سەیروسەمەرەو مەرگەساتئامێزەکانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ دێنینەوە یادو دەڵێین: سەرۆکی یەکێك لەدوو حزبە سەرەکییەکەی کوردستان، دەروازەی سنووری کوردستانی بۆ سوپای ستەمکار ئاوەڵاکردو یاریدەیدا کەتانك و زریپۆش و گاردی کۆماریی رژێمی بەعس، قەدەغەی بینای پەرلەمانی کوردستان ببەزێنن و گلاّوی بکەن، ئنجا شاری هەولێر داگیربکەن کە بەخوێن و قوربانیدانی خەڵکەکەی، لەراپەرینی ١٩٩١دا ئازادکرابوو. لەکاتێکدا مەسعود بارزانی" هاوکاری پاڵەوانی هێزی داگیرکەر لەسەر سنووری تورکیا ـ ئێران لەشیرین خەودابوو. تەنانەت ئەم مەرگەساتەش پیلانێکی داڕێژراوی دەزگای (C.I.A) بوو.

مێژوو ئەم رووداوانە لەبیرناکات، هەڵوێستی دەوڵەتە زلهێزەکانی تۆمارکردووە کەچۆن لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیان" کوردستانیان بەسەر چوار پارچەدا دابەشکردو ئێستاش بەهاوکاریی هەرچوار دەوڵەتی ناوچەکە (کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە) دەبنە کۆسپی بەری رێگەی دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد.

بەڵاّم ئەزموونی ئێستای گەلی کورد لەم بەشەی خاکی کوردستان لەباکووری عێراقدا" لەگەڵ هەموو کەموکوڕیو ناتەواوییەکی، مایەی رێزو سەربەرزیی هەموو کوردێکی بەشەرەف و ئازادیخوازە. ئەم ئەزموونە نوێیە دیموکراسییە، کەئاسایش و ئارامی تێدا بەرقەرارە، لاپەڕەیەکی نوێی لەبواری پەیوەندیی نێوان کوردو حکومەتی ئەمریکیدا هەڵداوەتەوە کەنیشانەی ئەوەیە مەسەلەی کورد، جارێکی تر کەوتۆتەوە ناو گۆڕەپانی سیاسیو، بۆتەوە بەوێردی سەرزاری سیاسەتمەداران و، دەشێ ئەمە رێگە خۆشکردنێك بێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردستانی گەورە.

کەواتە ئەمریکا دەبێت بەئەزموونە کۆنەکانیدا بچێتەوە، چونکە دەرەنجامی سوودو سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە" یان لەدەستدانو رووخانی، بەپلەی یەکەم لەئەستۆی ئەمریکایەو، بەپلەی دووەمیش لەئەستۆی خودی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیدایە.

### ڕۆڵی دەزگای ( C.I.A ) لەرووی گۆڕینی سیاسەت و حکومەتەکان لە جیهاندا

